هەندێک جار سەرەڕای ئەوەی هەموو کەسە خۆشەویستەکانمان جا هاوڕێکانمان بن، خێزانەکەمان بێت، یان تەنانەت هاوسەر منداڵەکانیشمان بێت لە دەورمانن

کەچی هەست بە تەنهایی دەکەین.

هەندێک کەس هەن لە ژیانتدا کە لە کاتی سەختی و خەمباریدا یارمەتیت دەدەن.

بەڵام هێشتا وا هەست دەکەیت کە ئەوان لێت تێناگەن و ناتوانن یارمەتیت بدەن.

بەڵام ئێمە وەک موسوڵمان، ئەم دیارییە بەنرخەمان پێبەخشراوە.

کاتێک پێمان وایە کە خەڵکی ناتوانن یارمەتیمان بدەن و لێمان تێبگەن، خودامان هەیە.

لە خۆت باشتر دەزانێت هەست بە چی دەکەیت. دەزانێت چی بۆت باشە و لە هەموو کەس زیاتر ئامادەیە لات. سوپاسی نیعمەتی ئیسلام بکەم.

**When we fail in life,**

**we can't undo the mistakes,**

**but it's never too late to make a change.**

**Think of the coming days as chances to make that change.**

کاتێک لە ژیاندا شکست دەهێنین،
ناتوانین هەڵەکان چاک بکەینەوە،
بەڵام هەرگیز درەنگ نییە کە گۆڕانکارییەک بکەین.
وەک دەرفەتێک بۆ ئەو گۆڕانکارییە سەیری ڕۆژانی داهاتوو بکە.



At some point in our life
we will face a calamity bigger than the others,
but patience is truly the key.
Think about how you have passed any other calamity and think about the millions of people before you that have also faced calamities
- maybe even bigger than yours.
If Allah knew you wouldn't be able to face it,
then why would He put you in that position?
Don't let that one thing
take away all your thoughts from living.
Be patient, since your Creator has promised;
« So, surely with hardship comes ease»

-Quran 94:5

لە هەندێک چرکەساتی ژیانماندا
توشی کارەساتێک دەبین کە لە کارەساتەکانی دیکە گەورەترە،
بەڵام ئارامگرتن کلیلی ڕاستەقینەیە.
بیر لەوە بکەرەوە کە چۆن سەختییەکانی دیکەت تێپەڕاند و
بیر لەو ملیۆنان کەسە بکەرەوە کە پێش تۆڕووبەڕووی
سەختی بوونەتەوە.
ڕەنگە لەوەی تۆش گەورەتر بووبێت.
گەر خودا بیزانیایە کە تۆ ناتوانیت ڕووبەڕووی ببیتەوە،
ئەوا بۆ دەیخستیتە بارودۆخێکی لەو شێوەیەوە؟
مەهێڵە ئەو شتە،
هەموو بیرکردنەوەکانت سەبارەت بە ژیانکردن لەگەڵ
خۆی بەرێت. ئارام بگرە، چونکە خالقەکەت بەڵێنی داوە:
«بەدڵنیاییەوە سەختییەکان تێدەپەڕن.»

**Always pray**
**that you are able to ask Allah**
**to remove your negative emotions**
**- whether it's fear, grief, anger or anxiety.**

هەمیشە سوپاسی خودا بکە
چونکە هێشتا دەتوانیت داوای لێبکەیت هەستە نەرێنییەکانت نەهێڵێت
- جا ترس، خەفەت، تورەیی و نیگەرانی بن.

In sad times
we tend to get a feeling
that the world is against us,
and that we don›t belong here.
That is actually quite true,
We don,t belong here.
This is not our place.
This is not our home.
Our eternal home is Jannah
This feeling is to remind you that this is all temporary
and a better, eternal life is waiting for you ahead.

لە کاتی دڵتەنگییەکانماندا
هەست بەوە دەکەین کە
دونیا دژمان دەجوڵێتەوە و
ئێمە هیی ئێرە نین.
ئەمە تەواو ڕاستە،
ئێمە هیی ئێرە نین.
ئەمە شوێنی ئێمە نییە.
ئەمە مەنزڵگای ئێمە نییە.
مەنزڵگای ئەبەدییمان بەهەشتە.
ئەو هەستەیە کە بیرت دەهێنێتەوە هەموو ئەمانە کاتیین و
ژیانێکی ئەبەدی و باشتر چاوەڕێتە.

It's sad when we give up on believing
that we are good in the eyes of Allah.
We ask others to make dua for us
because we think He might listen to their wishes
since they pray and read Quran regularly.
But Allah loves all of us.
If He didn't love you and if He had lost hope in you, then why are you still here?

جێی داخە ئەو کاتەی خۆمان وازدەهێنین، چونکە باوەڕمان وایە کە لای خودا باشین.
داوا لە کەسانی دیکە دەکەین دوعامان بۆ بکەن،
چونکە پێیان وایە کە خودا گوێ ڕەنگە گوێ بۆ خۆزگەکانی ئەوان بگرێت،
چونکە ئەوان نوێژ دەکەن و تاوەناوە قورئان دەخوێننەوە.
بەڵام خودا هەمووومانی خۆشدەوێت.
ئەگەر خودا خۆشی نەویستیایە یان بێئومێد بووایە لیت.
ئینجا بۆچی هێشتا لێرە دەبوویت؟

Draw a triangle
and place Allah at the top,
with a male and a female
on each remaining corner.
Now look how distant
the two people are from each other
while also being distant from Allah.
Now try to draw them closer to Allah
and see that the closer they get to each other,
the closer they get to Allah.
The rest is in the hands of Allah.

سێگۆشەیەک بکێشە
خودا لە سەرەوە دابنێ
ئافرەت و پیاوێکیش لە دوو لایەکەی دیکەی.
ئێستاش تەماشا بکە
ئەو دوو کەسە چەند لە یەکتر دوورن
گەر لە خودا دووربکەونەوە.
ئێستا هەوڵبدە نزیکتر لە خودا بیانکێشیت،
تا زیاتر لە یەکتر نزیک ببنەوە،
لە خوداش نزیکتر دەبنەوە.
ئەوەی دەمێنێتەوە لە دەستی خودایە.

Never wish that you were tested
with something else,
nor be upset about being tested
with something harder than someone else.
Everyone will be tested,
and some tests might be harder than others.
But the truth is that with tests comes rewards.
There is a reason why Allah specifically wants you
to be tested with a certain thing.
Maybe this test will give you more wisdom or patience; per-
haps the reward is in this life,
or you will be rewarded in the next.
The test is designed for you and only you.
The test you go through
is one Allah knows that you will pass.
So, keep your head up and put your faith in Allah.
Only then will you succeed.

هەرگیز ئاوات بەوە مەخوازە بە شتێکی تر تاقیبکرایتەوە
یان بەوە بێزار مەبە کە بە شتێک تاقیکراویتەتەوە کە لە هیی کەسێکی دیکە قورسترە.
هەمووان تاقیدەکرێنەوە،
ڕەنگە هەندێک لە تاقیکردنەوەکان لە هەندێکی دیکەین قورستر بن، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کا تاقیکردنەوەکان پاداشتیان لەگەڵە.
هەر لەبەر ئەوەیە کە خودا بە تایبەتی دەیەوێت، بە شتێکی دیاریکراو تاقیت بکاتەوە.
ڕەنگە ئەم تاقیکردنەوەیە ژیری و ئارامی زیاترت پێببەخشێت،
ڕەنگە پاداشتەکەی لەم دونیایەدا بێت،
یان ڕەنگە لە دونیاکەی تردا پاداشت بکرێیت.
ئەم تاقیکردنەوەیە بۆ تۆ دانراوە، تەنها تۆ.
ئەم تاقیکردنەوەیەی تۆ پێیدا تێدەپەڕیت،
خودا دەزانێت کە تێیدەپەڕێنیت.
کەواتە سەرت بەرز ڕابگرە و متمانەت بە خودا بیت، تەنها ئەو کاتە سەرکەوتوو دەبیت.

**Never give up on making dua,**
**especially in times of need.**
**Allah always listens;**
**sometimes it takes a little long to get an answer,**
**but that's because Allah is testing your patience.**

هەرگیز واز لە نزاکردن مەهێنە،
بە تایبەتی لە کاتی پێداویستیدا.
خودا هەمیشە گوێگرە، بەڵام هەندێک جار وەڵامدانەوە هەندێک زیاتری پێدەچیت، بەڵام ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە خودا سەبر و ئارامیی تۆ تاقی دەکاتەوە.

If you ever feel like
no one will be able to help or understand you,
then go to Allah.
Find a quiet place, light a candle, make a dua
and pour all your heart out to Allah.
Believe me,
your heart will suddenly crumble,
and all your worries will be taken away.
«Whoever puts his trust in Allah,
He will be enough for him.»

گەر هەر کاتێک هەستت کرد هیچ کەس ناتوانێت یارمەتیت بدات و لێت تێبگات، ئەوا پەنا ببە بۆ خودا.
شوێنێکی بێدەنگ بدۆزەرەوە، مۆمێک هەڵبکە. دوعا بکە،
تەواوی دڵت بۆ خودا هەڵبڕێژە
باوەڕم پێ بکە،
یەکسەر دڵت ئارام دەبێتەوە و
هەموو نیگەرانییەکانت دەڕەوێنەوە،
هەر کەسێک پشت بە خودا ببەستێت،
خودا بەسە بۆی.

**don't hang around behind a door of the dunya**
**which will not open;**
**stead realize a door of Jannah has opened for you.**

دوای دەرگا داخراوەکانی دونیا مەکەوە
لە کاتێکدا دەرگاکانی بەهەشت کراوەن.



Worrying and stressing over matters
is not going to change anything for you,
but instead will ruin your mental health.
Leave the things that are beyond your control
and have tawakkul
that Allah will take care of it.

خەمخواردن و بێتاقەت بوون دەربارەی کێشەکانت
هیچ شتێکت بۆ چارەسەر ناکەن،
بەڵکو لە ڕووی دەروونییەوە زیانت پێدەگەیەنن.
واز لەو شتانە بهێنە کە لە دەرەوەی کۆنترۆڵی تۆن.
تەوەکولت بە خودا بێت کە خودا خۆی ئاگاداریان دەبێت.

It feels like,
as soon as we hit a certain age, our focus shifts to getting married, Rather, our focus should be on ourselves and our connection with our Creator.
He has already written your name next to the one who is meant to be yours, and only yours.
So, if your trust and focus is only on Allah,
and your future partner's trust and focus is on Allah too, then surely Allah will soon bring the two of you together.

هەست دەکەین، هەر ئەوەندەی گەیشتینە تەمەنێکی دیاریکراو، سەرنجمان دەچێتە سەر هاوسەرگیری، بەڵام دەبێت تەرکیزمان بچێتە سەر خودی خۆمان و پەیوەندییمان لەگەڵ خالقماندا.
پێشتر ناوی تۆی نووسیوە لە تەنیشت ئەو کەسەی دەبێت بە هیی تۆ و تەنها بۆ تۆ دەبێت.
بۆیە ئەگەر متمانە و تەرکیزت تەنها لەسەر خودا بێت، ئەوا متمانە و تەرکیزی هاوسەری داهاتووشت تەنها لەسەر خودا دەبێت.
ئینجا بێگومان خودا زوو هەردووکتان بە یەکتر دەگەیەنێت.

Yes, maybe the wrongdoers live their life best and you, a believer, are continuously faced with trials.
You must always remember the reward that awaits the believers is in the afterlife.
«And never think that Allah is unaware of what the wrong doers do. He only delays them for a day when eyes will stare [in horror].»

• Quran 14:42

بەڵێ، ڕەنگە خراپەکارەکان باشترین ژیان بژین،
تۆش، وەک باوەڕدارێک، بەردەوام ڕووبەڕووی تاقیکردنەوە دەبیتەوە.
دەبێت هەمیشە لەبیرت بێت،
ئەو پاداشتەی کە چاوەڕوانی کەسی باوەڕدار دەکات،
لەو دونیایە.
هەرگیز وا بیرنەکەیتەوە کە خودا بێئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن، بەڵکو هەڵی گرتوون بۆ ڕۆژێک کە تێیدا چاوەکان ئەبڵەق دەبن-لە ترسدا-.»

سورەتی ئیبراهیم- ٤٢

It's easy to survive any difficulty if you think that, just like everything else, this is also something temporary.

تێپەڕاندنی هەر سەختییەک ئاسانە، ئەگەر وا بیربکەیتەوە کە وەک هەموو شتەکانی دیکە، شتێکی کاتییە.

Sabr comes in many ways.

The sabr for a future spouse might be difficult for some. But don't give up on believing that Allah has one for you just like He has for everyone else.

At the same time don't compromise on the qualities you have set for your future spouse.

Wait for a spouse who has the qualities you are looking for and always esteem the inner qualities of a person over their outward appearance.

سەبر لە چەند شتێکدا دەردەکەوێت.

سەبرگرتن لەسەر هاوسەری داهاتووی ژیان ڕەنگە بە لای هەندێک کەسەوە قورس بێت. بەڵام بەردەوام باوەڕت بەوە هەبێت کە خودا کەسێکی بۆ دیاری کردوویت، هەر وەک چۆن بۆ هەموو کەسێکی دیکەی دیاری کردووە.

لە هەمان کاتدا واز لەو تایبەتمەندییانە مەهێنە کە بۆ هاوسەری داهاتووتت دیاری کردووە.

چاوەڕێی ئەو هاوسەرە بە کە بۆی دەگەڕێیت، هەمیشەش ڕێز لە تایبەتمەندییە ناوەکییەکانی بگرە وەک لە تایبەتمەندییە دەرەکییەکان.

**Whenever something good from you is taken away, remind yourself that perhaps the thing you believed was good is not good for you, hence it was removed by the will of Allah, as a blessing**

هەر کاتێک شتێکی باشت لە دەست ڕۆیشت، بیری خۆتی بهێنەرەوە کە ڕەنگە ئەو شتەی تۆ باوەڕت وا بووە کە باشە بۆ تۆ باش نەبێت، چونکە خودا وەک نیعمەتێک لێی سەندوویتەوە.

Sometimes all you need is just a deep talk with the One who created your heart.

Strengthen your relationship with Allah because only He can give you the peace you are looking for and relieve you from the pain you are suffering from.

In every pain there is goodness; have sabr because it's only a test.

Always remember that Allah tests those whom He loves the most.

The Prophet ﷺ said:

«If Allah wills good for someone, He afflicts him with trials.»

- Sahih al-Bukhari 5321

هەندێک جار هەموو ئەوەی پێویستتە تەنها ئەوەیە بە قوڵی لەگەڵ خولقێنەری دڵت قسە بکەیت.
پەیوەندیت لەگەڵ خودا بەهێز بکە
چونکە تەنها ئەو دەتوانێت ئارامییەت پێببەخشێت کە بۆی دەگەڕێیت و ئەو ئازارەشت لە کۆڵ بکاتەوە کە پێیەوە گیرۆدەیت.
لە هەموو ئازارێکدا چاکەیەک هەیە، سەبرت هەبێت، چونکە تەنها تاقیکردنەوەیەکە.
هەمیشە ئەوەت لەبیر بێت کە خودا هەمیشە ئەوانە تاقیدەکاتەوە کە زۆری خۆشدەوێن. پێغەمبەرمان (ص) فەرموویەتی: «ئەگەر خودا چاکەی کەسێکی بوێت، تاقیدەکاتەوە.»

This life is only a test.
You will get tested time after time,
again and again.
Allah will make you worthy of entering His Jannah.
He will see if you can maintain sabr and believe in His plans even on the days where you feel so defeated and broken.
Sabr is not easy and has never been.
However, keep in mind that Allah is aware
and will make sure that your effort is not wasted.
Your patience is highly valued in the Eyes of Allah.

ئەم ژیانە تەنها تاقیکردنەوەیە، جار لە دوای جار تاقیدە کرێیتەوە، بۆ ئەوەی خودا بتکات بە شایستەی ئەوەی بچیتە بەهەشتەوە.
خودا سەیر دەکات بزانێت بەردەوام سەبرت هەیە و بڕوات بە نەخشەکانی هەیە، تەنانەت ئەو ڕۆژانەی هەست بە شکست و تێکشکانێکی زۆر دەکەیت.
ئارامگری هەرگیز ئاسان نییە و هەرگیزیش ئاسان نەبووە.
بەڵام با لە بیرت بێت کە خودا ئاگادارە دڵنیابە لەوەی کە هەوڵەکانت بە بەفیڕۆ ناچن. ئارامگرتنەکەت لە لای خودا زۆر بەنرخە.

In times of pain, try to be patient and happy.
Allah chose you to face this pain so that you don't feel attached to the dunya.
Imagine if your life was amazing and you had everything you yearned and wished for, Wouldn't you be attached to the dunya then?
Now be happy that you are going through difficulties.
It reminds us that this world is temporary
and that our eternal happiness awaits us in the hereafter.

لە کاتی ئازارەکاندا، هەوڵبدە ئارامگر و دڵخۆش بیت.
خودا بۆیە ئەم ئازارەی تووشکردوویت، بۆ ئەوەی زۆر بە دونیاوە پەیوەست نەبیت.
بیهێنەرە بەرچاوت گەر ژیانت زۆر خۆش بووایە،
هەموو ئەو شتانەشت هەبووایە کە خۆزگەیان بۆ دەخوازیت و تامەزرۆیانیت، ئەوکات پەیوەستی دونیا نەدەبوویت؟
ئێستا دڵخۆش بە کە بەم سەختییانەدا تێدەپەڕیت.
ئەوەمان بیردەهێنێتەوە کە ئەم دونیایە کاتییە و
بەختەوەرییە هەتاهەتاییەکەمان لەو دونیا چاوەڕێمانە.

When you catch yourself
in the middle of doing something haram,
look at it as a sign of Allah reminding you to stop.

کاتێک لە نێوەندی کردارێکی حەرامدا خۆت دەبینیتەوە،
بیرت بێت ئەوە نیشانەیەکی خودایە تاکو بیرت بهێنێتەوە بۆ
ئەوەی وازی لێبهێنیت.



If you think about it,
then there's actually nothing between you and Allah.
At any given time of the day or night
you can raise your hands
and ask Allah for whatever your heart desires.

ئەگەر بیری لێبکەیتەوە،
ڕاستییەکەی هیچ شتێک لەنێو تۆ و خودادا نییە.
لە هەر کاتێکدا بێت، جا شەو بێت یان ڕۆژ
دەتوانیت دەستەکانت بەرز بکەیتەوە
تا داوای ئەوە لە خودا بکەیت کە دڵت دەیخوازێت.

notice how meaningless and depressed this life becomes
then the focus is on the dunya and what it contains.

سەرنج بدە کە ئەم ژیانە چەند بێمانا و خەمناکە،
ئینجا سەرنجی دونیا و ئەوە بدە کە تێیدایەتی.

Look at sadness as a gift from Allah.
After a long time of distancing yourself from Him,
He wants you to turn back to Him
in order to help you back to the right path.
So, He puts you in a situation
where the only way out is to turn back to Him.

وەک دیارییەکی خودا سەیری دڵتەنگی بکە.
دوای ماوەیەکی زۆر دوورکەوتنەوە لێی،
خودا دەیەوێت ڕووی تێبکەیتەوە
تا یارمەتیت بدات بچیتەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە.
بۆیە دەتخاتە باروودۆخێکەوە
کە تاکە ڕێگای ڕزگاربوون ئەوەیە ڕووی تێبکەیت.

Evaluate your progress.

Have you become a better Muslim?

Have you gained more knowledge about Islam?

Have you done anything different

to become closer to Allah?

What progress have you made since last year?

بەردەوامبوونەکەت هەڵبسەنگێنە.

ئایا بوویت بە موسوڵمانێکی باشتر؟

ئایا زانیاریی زیاترت سەبارەت بە ئیسلام پەیداکردووە؟

ئایا هیچ شتێکی جیاوازت کردووە بۆ ئەوەی لە خودا نزیکتر ببیتەوە؟

ئایا لە ساڵی پارەوە لە چ شتێکدا چوویتە پێشەوە؟

**Do not be someone's trial,**

**especially regarding your parents.**

هەرگیز بڕیار لەسەر هیچ کەسێک مەدە،
بە تایبەت دایک و باوکت.

How do you expect to be protected,
if you're not willing to sacrifice any of your time
for the sake of the Protector?

چۆن چاوەڕێی پارێزگاری دەکەیت،
لەکاتێکدا هیچ کاتێکت بۆ ئەو زاتە تەرخان نەکردووە کە پارێزگارییت لێدەکات؟

It's said that
beautiful things
are often felt in the heart
and not seen with the eyes.
This is an excellent example of how we can't see Allah, but we feel His existence deep down in our hearts.

دەڵێن شتە جوانەکان بە چاو نابینرێن، بەڵکو لە دڵەوە هەست بە بوونیان دەکرێت.
ئەمە نمونەیەکی نایابە بۆ ئەوەی کە بۆچی ئێمە خودا نابینین، بەڵام لە قوڵایی دڵەکانماندا هەست بە بوونی دەکەین.

There's this voice in your head
that always tells you
whether something is permissible or forbidden.
Be wary of that voice
it appears because of your faith in Allah.

دەنگێک هەیە لە ناختدا کە بەردەوام پێت دەڵێت چ شتێک ڕێگەپێدراوە و چ شتێک قەدەغە.
ئاگاداری ئەو دەنگە بە، چونکە بە هۆی باوەڕبوون بە خوداوە دەردەکەوێت.

**Don't take too long to realize**
**that it is Him you need the most.**

**با زۆری پێنەچێت درک بەوە بکەیت،**
**کە ئەوە خودایە لە هەموو شتێک زیاتر پێویستت پێیەتی.**



If you are one of those people
who aren't consistent with your five daily prayers,
then you are most likely also one of those
who are distant from Allah in other ways.
Prayers are obligatory upon you,
so that you always remember
your connection with Allah.
Once you lose your prayers,
you have essentially lost everything.

ئەگەر تۆ یەکێکیت لەوانەی
پێنج نوێژە فەرزەکەی ڕۆژانەیان بە بەردەوامی ناکەن
ئەوا ئەگەری زۆرە یەکێک بیت لەوانەی
لە ڕێگای دیکەوە لە خودا دووربیت.
نوێژەکان فەرزن لەسەر شانت،
بۆیە دەبێت هەمیشە لەبیرت بێت،
کە پەیوەندییت لەگەڵ خودادایە.
هەر ئەوەندەی جارێک نوێژەکانت لە کیس چوو،
ئەوا هەمووشتێکت لەدەستداوە.

Never feel ashamed of Islamic principles
and especially not in front of the disbelievers.
It might be bothersome to stand out in a crowd
full of people who don't believe in what you do.
But we know there is wisdom behind everything
Allah has ordained for us.
This is the time you must remain firm in your deen.

هەرگیز شەرم لە بنەماکانی ئیسلام مەکە،
بە تایبەتی لەبەردەم بێباوەڕاندا.
ڕەنگە بێزارکەر بیت کە لەناو کۆمەڵێک کەسدا کە باوەڕیان
بەوە نییە تۆ دەیکەیت، هەڵبستیتە سەر پێ.
بەڵام ئێمە دەزانین کە لەپشت هەموو ئەو شتانەوەی کە خودا
بۆ ئێمەی دەستنیشان کردووە حیکمەتێک هەیە.
ئەمە کاتی ئەوەیە کە توند بە ئایینەکەتەوە پەیوەست بیت.

What differentiates a believer from a non-believer is that when a believer commits a sin,
he immediately feels ashamed and turns back to his Creator to ask for forgiveness.
Both Shaytan and Adam (peace be upon him) made mistakes, but Adam (peace be upon him) turned back to Allah whilst Shaytan did not.
Now who would you want to be like?

ئەوەی کەسێکی بڕوادار لە بێبڕوایەک جیا دەکاتەوە ئەوەیە کاتێک بڕوادارێک تاوانێک دەکات یەکسەر هەست بە شەرم دەکـات و ڕوو لە خالقەکەی دەکـات تا داوای لێخۆشبوونی لێبکات.
شەیتان و ئادەمیش (سەلامی خودای لەسەر بێت) هەڵەیان کرد، بەڵام ئادەم (سەلامی خودای لەسەر بێت) گەڕایەوە بۆ لای خودا، بەڵام شەیتان نەگەڕایەوە. ئێستا تۆ دەتەوێت وەک کامیان بیت؟

**Think about building a castle for yourself in Jannah instead of in the dunya.**

بیر لەوە بکەرەوە کۆشکێک لە بەهەشتدا بۆ خۆت دروست بکەیت نەوەک لە دونیادا.

**Never feel like**
**you can handle certain tasks all by yourself.**
**Even if you've accomplished things in the past,**
**you should realize that had it not been for Allah's mercy**
**that task would've remained undone.**

هەرگیز پێت وانەبێت کە تەنیا بۆ خۆت دەتوانیت هەندێک ئەرکی دیاریکراو جێبەجێ بکەیت.
تەنانەت ئەگەر لە ڕابردووشدا هەندێک شتت تەواو کردبێت، دەبێت درک بەوە بکەیت گەر ڕەحمی خودا نەبووایە ئەوا ئەو کارە هەر بە نەکراوی دەمایەوە.

**We get tired of asking Allah for things,**
**but Allah never tires of hearing what we wish for.**
**No matter how many times we ask,**
**Allah's blessings and bounties are endless.**

**ماندوو دەبین لەوەی داوای هەندێک شت لە خودا بکەین.**
**بەڵام هەرگیز خودا لەوە ماندوو نابێت گوێ لەوە بگرێت کە ئێمە خۆزگەی بۆ دەخوازین.**
**گرنگ نییە چەند جار داوا دەکەین،**
**نیعمەت و بەخشندەیی خودا سنوری نییە.**

**If you really care for yourself,
then let your heart find peace
by reciting or listening
to the Quran.**

ئەگەر بەڕاستی خەمی خۆتە
ئەوا چ لە ڕێگەی خوێندنەوەی قورئانەوە بێت
یاخود گوێگرتنەوە لێی ئارامی بە دڵت ببەخشە.

**Do not focus too much on the issues you have**
**because they are all tiny**
**in comparison to the blessings**
**Allah has showered upon you.**

زۆر سەرنج مەخەرە سەر ئەو کێشانەی هەتن
چونکە بە بەراورد بەو نیعمەتانەی خودا بەسەرتدا ڕژاندوویەتی
شتی بچووکن.

**Beware of giving life events more due than what they are**
**really worth.**

ئاگادار بە گرنگی زیاتر لەوە بە ڕووداوەکانی ژیانت مەدە کە شایستەیانە.



**Rely on nothing and no one except Allah.**

**جگە لە خودا پشت بە هیچ کەس و هیچ شتێک مەبەستە.**

**Nothing can happen without the will of Allah.**
**Turn your attention to Him,**
**since He alone can solve all your problems**
**and prohibit harm from reaching you.**
**While you focus on things that harm you,**
**He intends only goodness for you.**

بێ ویستی خودا هیچ شتێک ڕوونادات.
با سەرنجت لای خودا بێت.
چونکە بە تەنها ئەو دەتوانێت هەموو کێشەکانت چارەسەر بکات و ڕێگری لەوە بکات زیانت پێبگات.
کاتێک سەرنج دەخەیتە سەر ئەو شتانەی ئازارت دەدەن،
ئەوا خودا تەنها نیازی چاکەی بەوەیە.

**Sisterhood in Islam**
**is one of the most beautiful things.**
**Accompany yourself with sisters on the deen**
**and watch how much you'll prosper.**
**You'll slowly adopt their manners,**
**great mindsets and good habits.**

خوشکایەتی لە ئیسلامدا یەکێکە لە جوانترین شتەکان.
هەوڵبدە پەیوەندیی خوشکایەتییت لەسەر بنەمای ئایین بێت و
ئینجا سەرنج بدە کە چەند شت بەدەست دەهێنیت.
وردە وردە تۆش ڕەفتار و بیرکردنەوە و خووە باشەکانی ئەوان
وەردەگریت.

Use your sight wisely whilst you have it.
Spend it on seeking knowledge
and memorizing the Word of Allah.
One day you'll no longer have your vision
and you' ll regret not utilizing it to its fullest potential for the sake of Allah and your akhirah.

کاتێک چاوەکانت دەبینن ژیرانە بەکاریان بهێنە.
لە بەدەستهێنانی زانیاری و لەبەرکردنی قورئاندا بەکاری بهێنە.
ڕۆژێک دێت لە دەستیان دەدەیت و
پەشیمان دەبیتەوە کە بۆچی بەوپەڕی تواناتەوە
لەپێناوی خودا و ئاخیرەتدا بەکارت نەهێناوە.

**Performing salat consistently**
**should become a staple of your everyday life**
**and should be perceived as a privilege**
**given to you by your Creator rather than as a chore.**

نوێژکردن بە بەردەوامی
دەبێت ببێت بە کۆڵەکەی ژیانی ڕۆژانەت
دەشبێت وەک مافێک سەیر بکرێت کە خودا پێی بەخشیویت،
نەک وەک ئەرک.

Things we place importance
on are often quite insignificant for us.
These can be small tests which Allah has given us to see and to test our behavior.
Pray that Allah protects you from getting attached to the dunya and that He grants you love for Him and the akhirah.

ئەو شتانەی ئێمە گرنگییەکی زۆریان پێدەدەین
زۆر جار هیچ گرنگییەکیان نییە بۆ مان.
دەکرێت ئەمانە تاقیکردنەوەیەکی بچووک بن کە خودا بە ئێمەی دەبەخشێت تا کردەوەکانمان ببینێت و تاقیان بکاتەوە.
دوعا بکە کە خودا بتپارێزێت لەوەی بە دونیاوە پەیوەست بیت و خۆشەویستیی خۆی و ئاخیرەتت پێببەخشێت.

**Death is coming**
**and the dunya is only limited.**
**Life is so short; we just don't perceive it.**

مردن بەڕێوەیە، دونیاش سنوردارە،
ژیانیش زۆر کورتە، بەڵام ئێمە درکی پێناکەین.

Sometimes we tend to forget
that our next breath might be our last.
We get so caught up in the dunya
that we forget our purpose.
Pray to never become one of those people
who lose sight of why they were created.
Pray to be of the ones
whose life gets taken away
when Allah is most pleased with them.

هەندێک جار لەبیری دەکەین، کە هەناسەی دواترمان ڕەنگە دوا هەناسەمان بێت.
ئەوەندە گیرۆدەی دونیا بووین، کە مەبەست و ئامانجی خۆمانمان بیردەچێت.
دوعا بکە کە هەرگیز نەبیت بە یەکێک لەوانەی
کە لێیان وندەبیت کە بۆچی دروستکراون.
دوعا بکە یەکێک بیت لەوانەی
کە ئەو کاتە خودا ژیانیان لێ وەردەگرێتەوە
کە لێیان ڕازییە.

Sometimes we get involved in the haram and because nothing stops us, we perhaps believe that nothing can harm us either, But realize that if Allah had willed, that sin may have been the last thing you ever did.

Yet He gives you another chance to change. voke] as He hastens for them the good, their term would have ended for them. But We leave the ones who do not expect the meeting with Us, in their transgression, wandering blindly.»

- Quran 10:11

هەندێک جار دەکەوینە داوی حەرامەوە و
لەبەرئەوەی هیچ شتێک ڕاماننا گرێت،
ڕەنگە باوەڕمان وابێتکە هیچ شتێکیش زیانمان پێناگەیەنێت،
بەڵام بزانە گەر خودا بیویستایە،
ئەم گوناهە دەبوو بە دوا شت کە دەتکرد.
«بۆیە مۆڵەتی ئەوانە دەدەین کە بە هیوای دیداری ئێمە نین
-لە ڕۆژی دواییدا-، لەنێو گومڕایی و سەرکەشیی خۆیاندا
بسوڕێنەوە و بتلێنەوە.»

سورەتی یونس -

The Quran can guide you in the dunya
or it can be a witness against you in the akhirah.
Be careful to not be amongst the latter.

قورئان دەتوانێت ببێت بە ڕێنماییکارت لە دونیادا
یان دەتوانێت لە ئاخیرەتدا ببێت بە شاهیدێک لە دژت.
وریابە نەبیت بەوەی دووهەمیان.

We tend to complain about
how Allah makes everything unlawful for us
and list ayah after ayah of forbidden things.
But understand that what Allah has made unlawful for you is what's best for you, even when you believe otherwise.

ڕەنگە گلەیی ئەوە بکەین کە چۆن خودا هەمووشتێکی لێ حەرام کردووین و لیستی ئایەت لە دوای ئایەتی شتە قەدەغەکراوەکان دابنێین.
بەڵام تێبگە لەوەی ئەوەی خودا لێی قەدەغە کردوویت باشترینە بۆت، تەنانەت ئەگەر تۆ بڕواشت بە پێچەوانەکەی بێت.

Battle has been enjoined upon you while it is hateful to you. But perhaps you hate a thing, and it is good for you and perhaps you love a thing, and it is bad for you.
And Allah knows, while you know not.»

Ouran 2:216

«جەنگتان لەسەر پێویست کرا، کە لاتان ناخۆشە، دەگونجێت شتێکتان پێ ناخۆش بێت، کەچی باش و خێر بێت بۆتان، دەشگونجێت شتێکتان پێ خۆش بێت و خراپ بێت بۆتان، خودا –چاکە و خراپە-ی ئێوە دەزانێت و ئێوە نایزانن.»

If you ever feel like your iman has decreased
then accept the fact that it will not rise in the blink of an eye.
Shaytan will make it seem impossible for you to get back on track but understand that it takes small steps to build up that iman you once had.
Slowly remove bad habits and take small steps towards the good and suddenly you will be ready to attain that inner bliss again.

ئەگەر هەستت کرد کە ئیمانت لاوازبووە
دەبێت ئەوە قبوڵ بکەیت کە لە چاو تروکانێکدا زیاد ناکاتەوە.
شەیتان وا دەکات کە بەلاتەوە مەحاڵ بێت بکەویتەوە سەر ڕێچکەکەی خۆت،
بەڵام تێبگە لەوەی کە هەندێک هەنگاوی بچووکی دەوێت،
کە ئەو ئیمانە دروست بکەیتەوە کە جاران هەتبوو، وردە وردە واز لە خووە خراپەکان بهێنە، هەنگاوی بچووک بەرەو باشەکان بنێ، لەناکاو سەیردەکەیت ئامادەیت دیسانەوە ئاسودەیی ناخ بەدەست بهێنیتەوە.

Reaching a good and stabilized iman takes time;
it can be a long and hard journey for some.
But take every day
as an opportunity to learn more
about our beautiful religion
and see how grateful you become
whilst your connection with Allah strengthens.

گەیشتن بە ئیمانێکی جێگیر و باش کاتی دەوێت،
ڕەنگە گەشتێکی درێژ و سەخت بێت بۆ هەندێک کەس.
بەڵام هەموو ڕۆژێک وەک دەرفەتێک سەیر بکە تا زیاتر
لەبارەی ئایینە جوانەکەمانەوە فێرببیت،
ئینجا کاتێک پەیوەندییت لەگەڵ خودا بەهێز دەبێت
بزانە چەند سوپاسگوزار دەبیت.

**You want Allah to be persistent
in granting you the things you want,
so shouldn't you be persistent in doing things
that Allah wants?**

دەتەوێت خودا بەردەوام ئەو شتانەت پێببەخشێت کە دەتەوێن، ئەی باشە نابێت تۆش بەردەوام ئەو شتانە بکەیت کە خودا دەیەوێن؟



Always remember to ask for forgiveness,
and always remember to correct your mistakes.
You have plenty of time and chances,
which you take for granted,
but once it's all over a last chance will be what you beg Allah for on the Day of Judgement.

هەمیشە بیرت بێت کە داوای لێخۆشبوون لە خودا بکەیت،
هەمیشەش بیرت بێت کە هەڵەکانت ڕاست بکەیتەوە.
کات و دەرفەتی زۆرت لەبەردەستدایە، کە دەتوانیت سوودیان لێببینیت، بەڵام هەر ئەوەندەی تەواو بوون،
دوایین دەرفەت ئەوە دەبێت کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە خودا بپاڕێیتەوە بۆی.

Think about this:
If you needed an eye,
and someone wanted
to donate the money to you for a new one,
you'd accept it and be forever thankful, right?
Then why is it that you struggle to be equally as thankful,
if not more, to Allah?
He gave you two eyes - for free.
Always appreciate the things you have got and achieved.

بیر لەمە بکەرەوە:
ئەگەر پێویستت بە چاوێک بێت، کەسێکیش بیەوێت ئەو پارەیەت پێببەخشێت تا چاوێکی نوێ بەدەست بخەیت،
ئەوا قبوڵی دەکەیت و تاهەتایە سووپاسگوزاری دەبیت، وایە؟
ئەی باشە بۆچی هەوڵنادەیت بەو رادەیە، هەڵبەت گەر زیاتر نەبێت، سووپاسگوزاری خودا بیت؟
دوو چاوی بە خۆڕایی داویتەتێ،
هەمیشە سووپاسی ئەو شتانە بکە کە بەدەستت هێناون و پێیانگەیشتوویت.

You might feel like the five daily prayers are a burden.

The burden you feel makes you want to skip them.

The burden comes from you thinking

that you are not doing anything for yourself.

Because how many times do we do something for others without expecting anything in return?

It's the same mentality with prayers - you feel like you are doing something for Allah because He wants you to, and it's an endless cycle where you aren't getting anything in return. But in reality, these thoughts come from Shaytan.

For the truth is, you're praying to Allah because of your own needs. And this can be proved by a simple example.

When a calamity hits, you rush to prayer, but when life is going smoothly, you're lazy.

So, you only pray for yourself, and not for Allah.

ڕەنگە وا هەست بکەیت کە پێنج نوێژە فەرزەکە بەردێکی قورسن لەسەر شانت، بەردێک کە ڕەنگە وات لیبکات نەیانکەیت. هەستکردن بەم بەردە قورسە لەوەوە دێت کە وا بیردەکەیتەوە کە تۆ هیچ شتێک بۆ خۆت ناکەیت.
چونکە چەند جار شتێک بۆ کەسێکی دیکە دەکەین بێ ئەوەی چاوەڕێی شتێک بکەین لە بەرامبەردا؟
بۆ نوێژەکانیش هەمان شت دروستە- هەست دەکەیت کە شتێک لەبەر خودا دەکەیت، چونکە ئەو دەیەوێت بیکەیت، ئەمە بازنەیەکی بێکۆتاییە کە لە بەرامبەردا هیچ بەدەست ناهێنیت. بەڵام لە ڕاستیدا ئەم بیرکردنەوانە لە شەیتانەوەن.
چونکە ڕاستییەکەی ئەوەیە، لەبەر پێداویستییەکانی خودی خۆت نوێژ بۆ خودا دەکەیت. ئەمەش بە نموونەیەکی زۆر سادە دەسەلمێت. کاتێک توشی کارەساتێک دەبیت، خێرا دەچیت نوێژ دەکەیت، بەڵام کاتێک ژیان بە شێوەیەکی ئاسایی دەڕوات تەممەڵی دەکەیت.
کەواتە تۆ لەبەر خۆت نوێژ دەکەیت، نەک خودا.

**Tum back to Allah before it is too late.**

**بگەڕێرەوە بۆ لای خودا، بەر لەوەی کار لە کار بترازێت.**

**Think about a missed prayer as a missed opportunity to ask Allah for forgiveness.**

**وەک دەرفەتێکی لە دەستچوو بۆ داواکردنی لێخۆشبوون لە خودا، سەیری نوێژێکی فەوتاو بکە.**

Try to set a goal
that is good for your akhirah
and once it has been achieved, compare the feeling with an achieved worldly goal.
Then realize the difference between a goal which is set for the dunya compared to one for the akhirah.
If you feel more satisfied with the worldly achievement, then sadly you have become too attached to a temporary life full of temporary things.

هەوڵبدە ئامانجێک دابنێ کە بۆ ئاخیرەتت باشە، هەر ئەوەندە بەدەستت هێنا،
ئەو هەستە بەراورد بکە لەگەڵ بەدەستهێنانی ئامانجێکی دونیایی. دواتر درک بەو جیاوازییە بکە کە لە نێوان ئامانجێکدا هەیە کە بۆ دونیایە، لەگەڵ ئامانجێک کە بۆ ئاخیرەتە.
ئەگەر بە دەستکەوتە دونیاییەکان ئاسوودەتریت، ئەوا بەداخەوە کە وابەستەی ژیانێکی کاتی بوویت کە پڕە لە شتی کاتی.

It might be hard to find a good righteous friend
who can help you to adhere to the truth.
While searching for a good friend like that
try to become one yourself.
Your duties towards your friends are also
to offer sincere advice and guidance,
and to remind them of Allah and that death is real,
and that this world is not everlasting.

ڕەنگە سەخت بێت هاوڕێیەکی باشی سەرڕاست بدۆزیتەوە کە
بتوانێت یارمەتیت بدات پەیوەست بێت بە حەقیقەتەوە.
کاتێک بۆ ئەم هاوڕێ باشە دەگەڕێیت،
هەوڵبدە خۆت یەکێک بیت لەوان.
ئەرکی تۆ بەرامبەر هاوڕێکانت
ئەوەیە کە ئامۆژگاری و ڕێنمایی دڵسۆزانەیان بکەیت و
خودایان بیربهێنیتەوە و بیریان بهێنیتەوە کە مردن حەقە و
ئەم دنیایەش هەتاهەتایی نییە.

**Be grateful**
**that Allah gave you Islam**
**when you haven't even asked for it.**

سوپاسگوزار بە
کە خودا نیعمەتی ئیسلامی پێبەخشیویت
لە کاتێکدا داواشت نەکردووە.

**We tend to make certain things into a habit**
**and become addicted to them,**
**Instead of being addicted to the dunya,**
**then put more effort in your akhirah.**
**Make your prayers a routine and reading the Quran daily a giving to charity a habit.**

ئێمە حەز دەکەین هەندێک شت بکەین بە خوو و
ئالوودەیان بین،
بۆیە لە جیاتی ئەوەی ئالوودەی دونیا بیت،
هەوڵی زیاتر بدە بۆ ئاخیرەت.
نوێژەکانت بکە بە ڕۆتین و خوێندنەوەی قورئان و خێرکردنیش
بکە بە خوو.

Never think that your parents want the worst for you.

They are your guides and important for your development.

By the will of Allah, they will always be next to you in every step of your life. They raise you so that you can be ready for future challenges, help you to overcome calamities and guide you to the right path when you get led astray.

Never take them for granted for they are truly of the most precious gifts of Allah. Sadly, this is something many of us realize when it's too late.

Keep your parents close to you.

Inform them about your life situation and ask them for advice. Be there for them the same where they are there for you. Never disrespect them and always cherish and honor them. No one on the whole earth can love you as much as your parents do and no one except your parents would sacrifice their own life for yours

هەرگیز وا بیرنەکەیتەوە کە دایک و باوکت خراپەی تۆیان دەوێت ئەوان ڕێنماییکارتن و بۆ بەرەوپێشچوونت گرنگن.
بە ویستی خودا، لە هەموو هەنگاوەکانی داهاتووی ژیانتدا هەمیشە لە تەنیشتتەوە دەبن. ئەوان بۆ ئەوە پەروەردەت دەکەن کە تا بۆ سەختییەکانی داهاتوو ئامادە بیت، یارمەتیت دەدەن بەسەر سەختییەکاندا سەربکەویت و هەر کاتێک ڕێت ونکرد بەرەو ڕێگای ڕاست ڕێنوێنیت دەکەن. هەرگیز ئەوان بە کەم مەزانە، چونکە بەڕاستی بەنرخترین دیاریی خودان.
بەداخەوە ئەمە شتێکە کاتێک درکی پێدەکەین کە کار لە کار ترازاوە. با دایک و باوکت بەردەوام لێتەوە نزیک بن.
سەبارەت بە بارودۆخەکانی ژیانت ئاگاداریان بکەرەوە و داوای ئامۆژگارییان لێبکە. هەمیشە ئامادەبە بۆ یارمەتییدانیان، هەروەک چۆن ئەوان ئامادەن بۆ یارمەتییدانت. هەرگیز بێڕێزییان پێمەکە و هەمیشە ڕێزیان لێبگرە و بەرز ڕایان بگرە.
هیچ کەس لە تەواوی دونیادا ناتوانێت هێندەی ئەوان خۆشی بوێت و هیچ کەسیش جگە لەوان ژیانی خۆییت بۆ ناکاتە قوربانی.

Sadly,
we never realize how much time our parents spend on us.
From when we are born till, we reach adulthood,
Even after.
So why make yourself believe
that they would want the worst for you?
How can you think that you know better than they?
Remember that you came from them so don't treat them otherwise.

بەداخەوە هەرگیز هەست بەوە ناکەین کە دایک و باوکمان چەند کات لە پێناو ئێمەدا بەسەر دەبەن.
لەو کاتەوەی لەدایک دەبین، تا ئەو کاتەی پێدەگەین،
تەنانەت دوای ئەوەش.
کەواتە بۆچی باوەڕت وایە کە ئەوان خراپەی تۆیان دەوێت؟
چۆن دەتوانیت وا بیر بکەیتەوە کە تۆ لەوان باشتر دەزانیت؟
بیرت بێت کە تۆ لەوانەوە هاتوویت، بۆیە بە پێچەوانەوە ڕەفتاریان لەگەڵ مەکە.

**How can you be so gentle and soft**
**when you talk to your friends,**
**but be so harsh and cruel**
**when it comes to your mother?**

چۆن دەتوانیت هێندە هێمن و لەسەرخۆ بیت
کاتێک قسە لەگەڵ هاوڕێکانت دەکەیت،
بەڵام ئەوەندە ڕەق و توند بیت کاتێک دێتە سەرەی دایکت؟

You worry so much
when you've angered your friends
but couldn't care less
when it comes to your parents.
Why are you so focused on others
while the woman who suffered for you,
from before you were even born,
means nothing to you?

کاتێک هاوڕێکانت تووڕە دەکەیت
زۆر نیگەران دەبیت، بەڵام ناکرێت کەمتر لات گرنگ بێت
کاتێک دایک و باوکت تووڕە دەکەیت.
بۆچی هەموو سەرنجت لەسەر ئەوانی دیکەیە،
کاتێک ئەو ژنەی ئازاری زۆر چەشت لەپێناوتدا،
تەنانەت بەر لەوەی لەدایک بیت،
هیچ مانایەکی نییە لات؟

When we are young
you tend to put our focus on
what our friends think about us,
rather than what our parents think.
Focus on making your parents happy and proud,
not your friends.
Because the dua will come from their prayers
not your friend's.

کاتێک گەنجین
حەزمان لێیە تەرکیز بخەینە سەر ئەوەی
کە هاوڕێکانمان چۆن بیرمان لێدەکەنەوە.
نەک ئەوەی دایک و باوکمان چۆن بیرمان لێدەکەنەوە،
تەرکیز بخەرە سەر ئەوەی دایک و باوکت دڵخۆش بکەیت و
شانازیت پێوە بکەن،
نەک هاوڕێکانت.
چونکە ئەوانن لە نوێژەکانیاندا دوعات بۆ دەکەن،
نەک هاوڕێکانت.

Remind yourself
that nothing lasts forever,
not even your parents.
So, love them whilst you still have them.

بیری خۆتی بهێنەرەوە
کە هیچ شتێک تاهەتایی نییە،
تەنانەت دایک و باوکیشت،
بۆیە تا ماون لە ژیاندا خۆشتبوێن.



Once in a while we lose the connection we have with our Creator, We feel like our iman has fallen and we feel some kind of sadness and emptiness with our way of life.
Be sure that this period of time stays only for a short while because getting used to this will make it hard for you to get back on track.

لە چرکەساتێکدا کە پەیوەندییمان لەگەڵ خالقەکەمان دەپچڕێت، هەست دەکەین ئیمانەکەمان لەدەستداوە،
هەست بە جۆرێک لە دڵتەنگی و خاڵیبوون دەکەین لە ژیانماندا.
دڵنیابە لەوەی کە ئەم ماوەیە تەنها بۆ ماوەیەکی کورت بەردەوام دەبێت، چونکە ڕاهاتن بەمە وا دەکات سەخت بێت بگەڕێیتەوە سەر ڕێگای ڕاست.

Teach yourself to forgive people even when they are not asking to be forgiven.

You're not doing it for them; you're doing it for yourself.

The act of forgiving itself will help you gain more rewards increase your status, relieve you from unnecessary stress and above all you'll succeed in obtaining Allah's forgiveness.

فێربە لە خەڵک خۆشببیت

تەنانەت ئەگەر داوای لێخۆشبوونیشت لێنەکەن.

تۆ ئەمە لەبەر ئەوان ناکەیت، لەبەر خۆت دەیکەیت.

لێخۆشبوون بۆ خۆی یارمەتیت دەدات پاداشتی زیاتر بەدەست بهێنیت، پێگەکەت زیاتر بکەیت، لەو فشارە دەروونییەناپێویستە بەباشی ڕزگارت دەکات و لەسەرو هەموو شتێکیشەوە،

لە بەدەستهێنانی لێخۆشبوونی خوداشدا سەرکەوتوت دەکات.

At times of depression your focus should be on Allah.
It should be a time for you to strengthen your bond with your Creator.
Because, in times of need, we tend to look for help; and when no creature can help us, we start to lose hope, Instead, when no one can help you, ask help from your Creator.

لە کاتی خەمباریدا پێویستە خەیاڵت لای خودا بێت.
پێویستە کاتێک بێت بۆت
کە پەیوەندییت لەگەڵ خالقەکەت بەهێز بکەیت.
چونکە لە کاتی پێویستییەکاندا، حەز دەکەین بۆ یارمەتیی بگەڕێین،
کاتێکیش هیچ مەخلوقێک ناتوانێت یارمەتیمان بدات، ئیتر هیوامان نامێنێت،
لە جیاتی ئەوەی کە هیچ مەخلوقێک ناتوانێت یارمەتییمان بدات،
داوای یارمەتی لە خالقەکەت بکە.

Everyone makes mistakes
and we are meant to make mistakes.
But let the mistakes be something you learn from
and once faced with the truth,
correct yourself
and move on from them.
Don't find yourself trapped with mistakes
that will haunt you for the rest of your life.

هەمووان هەڵە دەکەن،
ئێمە بۆ ئەوەین کە هەڵە بکەین.
بەڵام با هەڵەکان ببن بە شتێ کە لێیانەوە فێر ببیت،
هەر ئەوەندەی ڕووبەڕووی ڕاستییەکە بوویتەوە،
خۆت ڕاست بکەرەوە و
لەسەریان بەردەوام بە.
بەو شێوەیە سەیری خۆت مەکە کە کەوتویتەتە داوی هەڵەکانەوە
کە تا کۆتایی ژیانت بەدواتەوە بن.

**Always pray to Allah to bless your parents and grant mercy upon them.**

هەمیشە داوای خێر و بەرەکەت و ڕژانی میهرەبانی
لە خودا بۆ دایک و باوکت بکە.

**No matter how highly you think of yourself**
**or how righteous you may think you are,**
**you must surround yourself with pious people**
**to remain humble.**
**Sincere advice, guidance and reminders in the light**
**of the Quran and Sunnah are always needed.**

گرنگ نییە چەند بەرز لە خۆت دەڕوانیت
یان ڕەنگە پێت وابێت کە چەند لەسەر حەقیت،
هەمیشە پێویستە چـواردەوری خۆت پڕ بکەیت لە کەسی ئیماندار.
تا بە خاکییانە بمێنیتەوە.
هەمیشە پێویستت بە ئامۆژگاریی دڵسۆزانە، ڕێنمایی، بیرهێنانەوەیە لەژێر ڕووناکیی قورئان و سوننەتدا.

You might struggle with your prayers,
reading the Quran or with dressing modestly.
But remember
that Allah sees it all
and rewards you for your struggles.
So, try as hard as you can
and repent from the things you struggle with.
Allah is the Most Merciful.

ڕەنگە ئەنجامدانی نوێژەکانت ،
خوێندنی قورئان، یان خۆداپۆشینت لا قورس بێت.
بەڵام بیرت بێت خودا هەموو ئەمانە دەبینێت،
لەپێناو هەوڵ و ماندووبوونەکانتدا پاداشتت دەداتەوە.
بۆیە تا دەتوانیت خۆت ماندوو بکە،
تۆبە لەو شتانە بکە کە بە لاتەوە قورسن.
خودا میهرەبانترینە.

If you ever get a sudden urge to fix your iman
and your relationship with Allah,
then never think of yourself as being weak.
The abrupt feeling is a blessing from Allah,
which is there for you to be reminded
that Allah is there for you,
Always.

ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان پێویستت بەوە بوو خێرا ئیمانەکەت،
پەیوەندییت لەگەڵ خودا چارەسەر بکەیت،
هەرگیز بەو شێوەیە لە خۆت مەڕوانە کە لاوازیت.
ئەو هەستە لەناکاوە نیعمەتی خودایە،
بۆ ئەوەیە کە بیرت بهێنێتەوە کە خودا
هەمیشە ئاگادارتە.

It's always easy to find excuses to not fast, pray or practice Islam, But you must start somewhere before it's too late.
Understand that the lazier you get with it, the harder it will be for you to get started.
You don't have to take huge steps. Just start with praying; if you already do, then do it on time.
The next step could be adding a few more minutes to make dua. Once your prayer is fixed then move on to the Quran.
Read a little once in a while; and if you don't know how to read, then listen to it.
Just take small steps towards Allah and watch how the journey becomes easier for you through His blessings.

هەمیشە ئاسانە بیانوو بهێنیتەوە بۆ ئەوەی نوێژەکانت نەکەیت، بەڕۆژوو نەبیت، یان ئەرکە ئایینییەکانت جێبەجێ نەکەیت، بەڵام بەر لەوەی زۆر درەنگ بێت دەبێت لە شوێنێکەوە دەست پێبکەیت.

لەوە تێبگە کە تا تەممەڵتر بیت، دەستپێکردنت قورستر دەبێت.

پێویست ناکات هەنگاوی گەورە بنێیت.

تەنها لە ڕێگەی نوێژکردنەوە دەستپێبکە، گەر بۆ خۆت دەیانکەیت، ئەوا هەوڵبدە لە کاتی خۆیاندا بیانکەیت.

هەنگاوی دواتر ڕەنگە تەرخانکردنی چەند خولەکێکی کەم بێت بۆ دوعاکردن.

هەر ئەوەندەی نوێژەکانت جێگیربوون، بچۆ بۆ قورئان خوێندن. جارێ کەمێک بخوێنەرەوە، ئەگەر نازانیت بیخوێنیتەوە، ئەوا گوێی لێبگرە.

تەنها چەند هەنگاوێک بەرەو خودا بنێ، ئینجا بزانە چۆن گەشتەکەت بەنێو نیعمەتەکانی خودادا ئاسانتر دەبێت.

**You might give up on Allah**
**but always pray that Allah never gives up on you.**
**Once you have lost Allah you have lost everything.**

ڕەنگە واز لە خودا بهێنیت،
بەڵام هەمیشە دوعای ئەوە بکە کە هەرگیز خودا واز لە تۆ نەهێنێت.
هەر ئەوەندەی خودات لەدەستدا، ئەوا هەمووشتێکت لەدەستداوە.

Feeling guilt when doing something wrong or impermissible is associated with the fact that we belong to Allah, Your brain, hands, eyes and mouth are things which you have borrowed from Allah, so understand the beauty of the body rejecting things which are haram.
It does that to protect itself from the hellfire of Jahannam.

کاتێک کارێکی هەڵە یان ڕێگە پێنەدراو ئەنجام دەدەیت و هەست بە تاوان دەکەیت ئەمە پەیوەندی بەو ڕاستییەوە هەیە کە هەموومان بۆ لای خودا دەگەڕێینەوە،
مێشکت، دەستەکانت، چاوەکانت، دەمت شتگەلێکن کە تۆ لە خودات قەرزکردوون، بۆیە لە جوانیی جەستەت تێبگە، حەرامەکان ڕەتبکەرەوە.
جەستەت بۆ خۆی ئەو کارە دەکات تا لە ئاگری دۆزەخ بتپارێزێت.

If you have a thought to do a good deed or a favor for someone, then don't wait to do it tomorrow or in a week.
The same goes for if you want to change some of your bad behavior or your way of life.
If you want to change, then change today; if you want to become a better Muslim, then do so today.
The more you tell yourself that you will do so «soon», the easier it becomes for Shaytan to forever prevent you from reaching that goal.

هەرکاتێک ویستت کارێکی باش ئەنجام بدەیت یان چاکەیەک لەگەڵ کەسێک بکەیت،
ئەوا چاوەڕێی سبەی یان هەفتەی داهاتوو مەکە.
هەمان شت ڕاستە بۆت گەر بتەوێت هەندێ لە ڕەفتارەکانت یان شێوازی ژیانت بگۆڕیت.
ئەگەر دەتەوێت بگۆڕێیت، ئەوا ئەمڕۆ بگۆڕێ، ئەگەر دەتەوێت ببیت بە موسوڵمانێکی باشتر،
ئەوا ئەمڕۆ ببە.
تا زیاتر بە خۆت بڵێیت کە کارەکە زوو دەکەیت، ئەوا ئاسانتر دەبێت بۆ شەیتان بۆ ئەوەی تاهەتایە ڕێگریت لێبکات
لەوەی بگەیت بە ئامانجەکەت.

Compare yourself to the Companions of the Prophet,
Try to compete with them, look up to them
and try to be just like them.
If you find it hard to equal your own deeds with theirs,
then try to compete with the sinners in asking for Allah's
forgiveness.

خۆت بە هاوەڵانی پێغەمبەر بەراورد بکە،
هەوڵبدە کێبڕکێیان لەگەڵ بکەیت، چاویان لێبکە،
هەوڵبدە دروست وەک ئەوان بە.
ئەگەر بەلاتەوە قورسە کار و کردەوەکانی خۆت لەگەڵیان یەکسان بکەیت،
ئەوا هەوڵبدە کێبڕکێ لەگەڵ تاوانبارەکان بکەیت لە داوای لێخۆشبوونکردندا لە خودا.

When you feel like your iman has fallen,
then think about ways to raise it again.
Take a pen and paper and write down a few things from your day which have kept you from working on your akhirah.
Each day remove one of those things from your day and replace it with a thing Allah loves
and see how your iman will rise again.

ئەگەر هەست دەکەیت ئیمانت بەرەو لەناوچوون دەچێت
ئەوا بیر لەو ڕێگایانە بکەرەوە کە دیسانەوە دەتوانیت ئیمانەکەت زیاد بکەیتەوە.
قەڵەم و کاغەزێک بهێنە،
چەند شتێکی کەمی ڕۆژەکەت بنووسە،
کە ڕێگربوون لەوەی کار بۆ ئاخیرەتت بکەیت.
هەموو ڕۆژێک یەکێک لەو شتانەی ڕۆژەکەت کەم بکەرەوە،
شتێکیش بخەرە شوێنی کە خودا پێی خۆشە
ئینجا بزانە چۆن دیسانەوە ئیمانەکەت زیاد دەکات.

**Allah has given you the opportunity**
**to make dua for the things**
**you are not capable of getting by yourself**
**- whether big or small.**

خودا دەرفەتی ئەوەی پێبەخشیویت
کە دوعا بۆ ئەو شتانە بکەیت
کە بۆ خۆت ناتوانیت بە تەنها بەدەستیان بهێنیت
جا چ بچووک بن، چ گەورە.

**We were created by Allah for Allah.**
**You don’t have to please anyone**
**except Allah.**

**ئێمە لە لایەن خوداوە دروستکراوین و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.**
**پێویست ناکات جگە لەو هیچ کەس لە خۆت ڕازی بکەیت.**

Whether you're experiencing
temptation, grief, heartbreak or loss,
you should know that Allah can fulfill all of your needs.
Everything is somehow replaceable by the will of Allah,

گرنگ نییە گەر بە وەسوەسە، خەفەت، دڵشکان، لەدەستداندا تێدەپەڕیت،
دەبێت بزانیت کە خودا دەتوانێت هەموو کارەکانت بۆ چارەسەر بکات. هەمووشتێک بە ویستی خودا دەگۆڕێت.

Allah can encompass every emptiness that you might have,
He can heal every pain you deal with
and forgive you for the sins that may haunt you.
Turn to Allah so that He can set you free from the sorrows.

خودا دەتوانێت هەموو ئەو بۆشاییانەت بۆ پڕ بکاتەوە کە ڕەنگە هەتبن،
دەتوانێت هەموو ئەو ئازارانەت بۆ تیمار بکات کە پێیانەوە دەتلێیتەوە،
ڕوو لە خودا بکە، چونکە تەنها ئەو دەتوانێت لە هەموو خەمەکان ڕزگارت بکات.

Look at life as a journey towards Allah.

ژیان وەک گەشتێک بەرەو خودا ببینە.



**Even the help that comes from people**
**is kindness that Allah has given them**
**so that they were able to help you.**

تەنانەت ئەو یارمەتییانەش لە خەڵکییەوە دەیانبینیت،
میهرەبانیی خودایە پێیبەخشیون،
چونکە ئەوان توانیان یارمەتیت بدەن.

Happiness feels great
but somehow it makes us distant from Allah.
We don't feel like we need anything at the moment
so why should we obey or be grateful to Allah?
But as pleasant as ease feels it is hardship
that ultimately brings you near to Allah.

بەختەوەری هەستێکی زۆر نایابە،
بـەڵام بە جۆرێک لە جۆرەکان وامـان لێدەکات لە خودا دووربکەوینەوە.
هەست ناکەین لەم چرکەساتەدا پێویستمان بە هیچ شتێک بێت.
کەواتە بۆچی گوێڕاڵ یان سووپاسگوزاری خودا بین؟
بەڵام هێندەی ئەو خۆشی و ئاسانییە هەست دەکەیت قورسە
کە لە کۆتاییدا لە خودا نزیک ببیتەوە.

**Having tawwakul, sabr and making dua will take you a long way.**

هەبوونی تەوەکول بە خودا، سەبر، دوعاکردن بە شوێنگەلی دوورت دەگەیەنن.

Some things might seem impossible for you to achieve, which perhaps they are. Because not everything can be achieved by ourselves.

This is why we face difficulties;

so that we can turn to Allah for help by making dua, being vigilant with our salat and finally having tawwakul in Allah.

بەدەستهێنانی هەندێک شت ڕەنگە بەلاتەوە مەحاڵ دەربکەون، کە ڕەنگە واش بن.

چونکە هەمووشتێک بە خودی خۆمان بەدەست نایات.

هەر لەبەر ئەمەشە ڕووبەڕووی سەختییەکان دەبینەوە،

بۆ ئەوەی ڕوو لە خودا بکەین یارمەتیمان بدات، ئەویش لە ڕێگەی دوعاکردن ئاگاداربوونی نوێژەکانمان،

لە کۆتاییشدا بوونی تەوەکول بە خودا.

**Never think that you are alone,**
**for as long as you have Allah**
**you have everything.**

هەرگیز وا بیر نەکەیتەوە کە بە تەنهایت،
مادام تۆ خودات هەیە، خاوەنی هەمووشتێکیت.

**We can never depend on things, people or even ourselves.**
**But the One we can always rely on is Allah.**

ئێمە هەرگیز ناتوانین پشت بە شتەکان، خەڵکی، تەنانەت خۆشمان ببەستین.
بەڵام ئەوەی دەتوانین هەمیشە پشتی پێببەستین خودایە.

When you ever feel confused about being Muslin
then ask yourself,
if Islam wasn't a true religion
then why would so many people follow it?
And how came it to be
the fastest growing religion in the world?

ئەگەر ڕۆژگارێک هەستت بە سەرلێشێوان کرد سەبارەت بە موسوڵمانبوونت،
ئەوا لە خۆت بپرسە،
ئەگەر ئیسلام ئایینێکی ڕاست نەبووایە، ئەوا ئەو هەموو خەڵکە بۆچی شوێنی دەکەوتن؟
ئەی چۆن دەبێت بە خێراترین ئایین لە ڕووی گەشەکردنەوە لە جیهاندا؟




**Description**

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لە لایەن ئازیزێکی چەناڵ کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

---

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

Invite Link

دەبێت ئابڕووت سەنگێکی گەورەی هەبێت لە دڵتدا.

Your haya should hold a large worth in your heart.

ئەگەر نەفست بە ڕاستییەوە سەرقاڵ نەکەیت، ئەوا مەیلی ئەوەی دەبێت بە درۆوە سەرقاڵ بێت.

If you don't keep your nafs busy with the truth, it will be tempted to get busy with a lie.

ببە بەو کەسەی کە پاداشتێکی گەورە لە بەهەشتدا وەردەگرێت، نەک ئەو کەسەی بەهەشتی دەوێت و هیچی بۆ ناکات.

Be the one who anticipates a great reward in Jannah instead of the one who wants Jannah but does nothing to get there.

ئەو شتانە دەیانکەیت و ڕێگری دەکەن لە دڵخۆشبوون چێژبینینت، ئەوا بێگومان ئەوانەن کە شتی دوونیاین و هیچ سودێک بە ئاخیرەتت ناگەیەنن.

The things you do which prevent you from feeling happiness and pleasure, are surely those that are most likely meant for your dunya and not akhirah.

Warzer

کتێبخانەی گۆڵدن بووک
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
07701598762 - 07501444434

GOLDEN BOOK